# دیوانی سالم

« عبدالرحمان بەگی صاحبقران »

لێم گەڕێن با گۆشەگیر بم دەستەو ئـەژنۆ کەف زەنان
گێژەلووکەی بای نەدامەت تاری کرد صفحەی جیهـان

صاعقەو بەرقي نحووسەت ظلمەتي دا شەرق و غەرب
بەردە بارانە بـە مخصوصی لە سـەر مڵکي بەبان

یطلب من المطبعة محمّدی فی مدینة سقز

« کردستان »

# دیوانی ســـالم

## « عبدالرحمان بەگی صاحبقران »

لێم گەڕێن با گۆشەگیر بم دەستەو ئـــەژنۆ کەف زەنان
گێژەلووکەی بای نەدامەت تاری کرد صفحەی جیهـــان

صاعقەو بەرقي نحووسەت ظلمەتي دا شەرق و غەرب
بەردە بارانە بــە مخصوصی لە ســـــەر ملکي بەبان



# سەرچاوەکانی ئەم دیوانە

١ – کەشکۆلی ژمارە ( ٤ ) کە ( ٧٠٠ ) لاپەڕەیە .
٢ – » » ( ٥ ) کە ( ٤٤٨ ) »
٣ – » » ( ١٦ ) کە ( ٢٣٦ ) »
٤ – » » ( ١٧ ) کە ( ٣٠٧ ) »
٥ – » » ( ٢١ ) کە ( ٢٥٨ ) »
٦ – » » ( ٢٣ ) کە ( ٤٦٢ ) »
٧ – ئەنجوومەنی ئەدیبان - یادگاری خوا لێ خۆش بوو ئەمین فیضی بەگە .
٨ – کۆڤاری دیاری کوردستان سالی ( ١٩٢٥ ) ژمارە ( ٤ ، ٧ ، ١١ ، ١٢ ) .
٩ – کۆڤاری رزگاری ژمارە ( ١٠ ، ١١ ، ١٢ ) سالی ١٩٧٠ چامــە ( قصیدة )ی ( لێم گەڕێن باگۆشەگیر بم ) بە پێنووسی مامۆستا ( محەمەد مستەفا کوردی ) ( ٤٣ ) تاکی لێ بەخش کراوە .
١٠ – رۆژنامەی ژین ژمارە ( ٣٥ ) ١٢-٨-١٩٧١ بەپێنووسی دۆکتۆر کەمال فوئاد ( ٤٨ ) تاك لەم چامەیە بەخش کراوە :
( بەدە ئەحوالی ئەشخاصی کەخاصی ملکی بابانن )
١١ – دۆکتۆر ئیحسان فوئاد .
١٢ – مێژووی وێژەی کوردی - مامۆستا ع. سجادی .
١٣ – حاجی محمدامین رەباطی برین پێچ لە کەرکوکەوە چەند غەزەلێکی سالمی بۆ ناردووم کەلەدیوانەکەیدا نەبوو .
١٤ – سالم لەتای تەرازووی وێژە دا - ئەحمەد سالار .
١٥ – دیوانی سالم چاپی بەغدا لەسالی ( ١٩٣٣ )دا کوردیو مەریوانی چاپیان کردووە .

# پێشکەشە :-

بۆ ڕەوانی پاکی ئەو کەسە کەیەکەمین کەسە چاپخانەی لە (١٩١٥)دا بۆ ڕاژەی زمان و وێژەو مێژووی کوردان دامەزراندووە .

بـۆ ئەو زانایەی کەیەکەمین کەسە مێژووی کوردانی بە زمانی کوردی نووسیوەتەوە .

بۆ ئەو کەسەی کەبەبێ پشتیوانو بەبێ کەسی بەتاقی تەنیا لەسەرەتای ژیانی‌یەوە تا سەریان پێ‌ناوە لەبەرا (خزمەت)ی گەلو نیشتمانەکەی دووا نەکەوتو هەدای نەداوە .

بۆ ئەو کەسەی کەلەسەردەمی وی‌دا هیچ کەسێك لەلایەن خەباتو تێکۆشـان و گیانبازی‌یەوە نـەیتووانیوە شان لەشانی وی بداتو بەربەرەکانی بکات .

بۆ ئەو کەسەی کەهیچ هێزێك بەهیچ بارێـکی‌دا نەیتووانیوە لەسەر ڕێچـــەی ڕاستەقینەی لابدات .

بۆ ئەو کەسەی شایانی ئەوە بوو کەلەناو شارەکانی گەرمێن لەپێش هـەموو کەسێکی‌دا ئاپیدە (تمثال)ی بـۆ دروست بکرێ و لەپێش هەموو کەسێکی‌دا ئاهەنگی بیرەوەری بۆ ساز کرێت کەچی وەدووای هەموو کەسێکی کەوت .

وا دەردە کەوێ کە داماو (حوزنی) هەروەکوو لەسەردەمی ژیانی‌دا بێ کەس بوو لەپاش کۆچ پێ کرانیشی‌دا هەر بێ کەسە .

# « پێشەکی »

چاپخانەی کوردستان کەیەکەمین چاپخانەیە بۆ ڕازەی زمان و وێژەو مێژووی کوردان لەساڵی ( ١٩١٥ )دا دامەزراوە وەبەرکی سەرشانی خۆمان زانیوە کەلەو ماوەیەدا بەپێی تواناو دەستەڵاتی خۆمان بەبێ ئەوەی کەهیچ کوردێك یالایەنێك بەئەندازەی فلسێکمان یارمەتی بدا (*)

گەلێك پەرتووکی وێژەیی و مێژوویی و فەرهەنگ و چیرۆك و .. ئیترمان پێ بەخشکردووە بەتایبەتی زۆرترینی دیوانە کۆنەکانمان لەناو گێژاوی گومناوی و لەناو چوون ڕزگار کردووەو خستوومانەتە بەردەستی وێژە پەروەرانەوە .

سالم کەخۆی لەسەردەمی دەوڵەتی بابانەکان دابووەو بەچاوی خۆی ڕووخانی سەرای ئازادی کوردانی دیتووە بەپێچەوانەی ( نالی و کوردی ) شۆرو سەوداو جۆش و خرۆشێکی پاکی کوردایەتی پەرباو هاوارو دادێکی لەدەست زۆرو بێدادی جانەوەرانەی عوسمانیان کردووە ، کۆرێکی شین و شەپۆڕی سەبارەت بەلەناو چونی دەوڵەتی بابان گرتوە ، قورێکی وای بۆ پەرێشانی و بەلەنگازی ولێقەوماوی کوردان پێواوە کەکەس نەیکردبێ .

---

(*) بەپارە نا بەڵان هەندێك کەس لەبەر ئەوەی کەچاویان بەئێمە هەڵنایەو یاوەکوو ئێمەیان لەبار دا نیە لەبەر خۆپەرستی و نەکێشان لەبارەی چاپەمەنیەکانی ئێمەوە لەچاوو ڕەپوی خراپ کۆتایی یان نەکردووە گۆیاگیو دەستی لەدیوانەکان داوەو ووشەی بێگانانی وەرگێڕاوەتە سەر کوردی . ئایا کردەوەی وا هەڵبەستەکان لەنگ ناکا ؟ ئایا منداڵیش کردەوەی وا دەکا ؟ خۆ ئەگەر بێن بەراوەردێکی دیوانەکان لەگەڵ ئەو هەموو کەشکۆڵ و دەستنووسانەی لای ئێمە بکەن لەسەر مەزاریان سەریان هەڵنایەو ڕاستی و درۆی هەموو لایەکیش دەردەکەوی

بەندە هەر لەڕووی ئەو هەستە پاکە ئاسمانییەوە هەمیشە لە کەڵکەڵەی ئەوە دابووم کەدیوانی ئەو کوردە زاناو کوردستان پەرستە بەهەڵبەستە نیشتمانیەکانیەوە لەچاپەکەی پێشووی پوخت تر چاپو پێشکەشی وێژە پەروەرانی بکەم بەڵام لە ڕووی ئەوەوە کەچاپەکەی پێشووی پڕ لەهەڵەو چەوتیو لەنگی بوو لەوانەیە کە هەڵەی چاپی زۆر بیو هەم بەخشکارەکان نەیانتوانی بی دەستنووسە کۆنەکان باش بخوێننەوە ناچار بەهۆی کەشکۆڵەکانی لای خۆم هەر خەریکی ڕاستکردنەوەی چەوتیەکانیان بووم‌و چەند هەڵبەستێکی چاپ نەکراویشم دەستکەوت . خۆشبەختانە مامۆستا محەمەد مستەفا کوردیش لە ( ١٩٧٠ )دا چامە بەرزەکەی سالم کەبە ( لێم گەڕێن با گۆشە گیر بم ) دەست پێ دەکات لەناو ژمارەکانی ( ١٠ - ١١ - ١٢ )ی کۆڤاری ڕزگاری لە ١٩٧٠ دا چاپکردووە .

بیستم کەدۆکتۆر کەمال فوئادیش لەئەڵمانیاوە چەند پارچە هەڵبەستێکی سالمی هێناوەتەوە . لەبەغداو سلێمانیو هەولێردا سێ جارم چاو پێ کەوت تکام لێ کرد کەهەڵبەستەکانی سالمی بدا بەمن ، وەڵامی هەرسێك جارەکانی هەر ئەوەبوو کە( من خۆم خەریکم چاپی کەم کەنەمکرد دەیاندەم بەتۆ ) کەچی داخەکەم خۆشی نەیکرد ودایە یەکێکی تر منیش کەهومێدم بەو نەماو بۆ ئەوەی ئەم پرۆژە نرخدارە دووا نەکەوێ بەهۆی کەلەپووری کەشکۆڵە کۆنەکانی لای خۆمەوە ئەوەندەی کە بۆم دۆزرایەوە هەڵەو چەوتیەکانیم لابرد ئەوانەی کەچارەشیان نەکرا بێ دەست لێدان وەکوو خۆیانم هێشتەوەو چەند شووێنێکیش کەباش نەخووێندرانەوە بەنوختەم پڕ کردنەوە .

بڕگەی ( ئە ) کەئێستا لەخاکی باکی بابانو چەند شووێنێکی تردا دەخرێتە پێش کردارانەوە.لەناو کەشکۆڵە کۆنەکاندا بۆ هەڵبەستەکانی کوردیو نالیو سالمدا بەکار نەبراوە بەڵکوو بڕگەی ( دە ) بەکار براوە ، هەر کەسێکی بیەوێ لەم مەبەستەی بۆ ڕوون بێتەوە دەتوانێ کەشکۆڵەکانمان ببینێ .

# بەسەرهاتی سالم

ئەو نیشتمان پەروەرە ناوی عبدالرحمان بەگ کوڕی محمد بەگی قەرە جەهەننەمی کوڕی احمدبەگی‌یە لەبنەماڵەی‌صاحبقرانانەو ئامۆزای کوردی‌یە . بنەماڵەی صاحبقرانان لەئەحمەد بەگی گەورەوە دەست پێ دەکات کەیەکێك بووە لەدووازدەسوارەی مەریوان لەبنەچەکەدا کوێستانین تەنها محمود بەگی کوڕی دەکەوێتە گەرمێنی و دەبێتـــە وەزیری جەنگی دەوڵەتی بابانەکان .

محمود بەگ پێنج کوڕی بوون : ( ئەمین بەگ ، حەمید بەگ ، مستەفا بەگ ، داود بەگ‌و ئیبراهیم بەگ ) .

١- ئەمین بەگ کرابووە دەفتەرداری خاکی حیجازی‌و هەر لەوێش کۆچی دوایی کردوە وەنەتەوەی لەوێ ماوون .

٢- حەمید بەگ دەچێتە سنەو لەوێ دەمرێ ، قادر بەگ‌و کوڕێکی تـری لەپاش بەجێ دەمێنی ، عادلە خانمی ژنی وەسمان پاشای جاف کچی ئەو قادر بەگەیە ، ئەو بنەماڵەیە ئێستاش لەکوێستانی‌دا نەتەوەیان زۆرە .

٣- مستەفا بەگ ، هەستیاری بەناوبانگ ( کوردی ) .

٤- داود بەگ دەچێتە مەکە بۆ لای ئەمین بەگی برای‌و ئەویش لەوێ دەمـرێ‌و دوو کوڕی لەپاش بەجێ دەمێنی : حاجی عوسمان بەگ‌و حاجی حسێن بەگ . حـاجی عوسمان بەگ دوو کوڕی بووە : عوسمان بەگ‌و شەوکەت بەگ . حاجی حسێن بەگیش دوو کوڕی بووە : صالح زەکی بەگ‌و داود بەگ .

٥- ئیبراهیم بەگ لەسلێمانی بووەو فتاح بەگی بووە . فتاح بەگیش تەوفیق بەگ و نوری بەگ‌و بووێژی بەناوبانگ‌و کوردستان پەرست ئەحمەد حـــەمدی بەگی بووە .

ئەو بنەماڵەیە لەڕووی ئەوەو کەلەبنچینەدا کوویستانی بوون هەمیشە هام‌و شۆی کوویستانیان دەکرد .

# پلەی خوویندەواریتی و هەستیاریتی سالم

سالم لەمزگەوتانەدا خووێندوویەتی‌و زۆر دلی بەویژەو هەلبەستان گەشاوەتەوە زۆرترینی کاتی خۆی بەخووێندنەوەی هەلبەستان‌و بەسەرهاتی بوویژان بەسەر دەبردو زۆر شەیدای هەستیاریتی نالی‌و کەلیمی کوردی هەمەدانی بووە .

وایان ڕاگەیاندووە کەهۆی هەلقولانی سەرچاوەی هەستیاریتی وی ( بەهێ ) ناوێکی خزمی خۆی بووە کەگراو (عاشق)ی بوو . بەلان بەبڕوی بیروبڕوای من لەناو چوونی شان‌و شکۆی دەولەتی بابان‌و کارەساتێکی کەلەلایەن داگیرکەرەکانی عوسمانی‌یانەوە بەسەر کوردو کوردستان هاتووە ئاگری دل‌و دەروونی سالمی جۆش داوەو خستوویەتە سەر هەوەسی هەستیاریتی‌یەوە ، هەلبەستە نیشتمانی‌یە ئاگرینەکانی گەورەو گرنگ ترین بەلگەن بۆ ئەم مەبەستە .

---

مشاهیر الاکراد بوونی سالمی لە ( ١٢٢٠ )ی کۆچی‌دا نیشانداوەو لەبابەت کۆچی دوایی وی‌یەوەی هیچ نەنووسیوە .

لەدیوانەکەی سالمی‌دا کەکوردی‌و مەریوانی لەسالی ( ١٩٣٣ ) دا چاپیان کردووە بوونی سالم لە ( ١٢٢٠ )و کۆچی دوواییشی لە ( ١٢٨٦ )دا نیشاندراوە .

مامۆستا ع. سەججادی لــە مێژووی وێژەکەیدا بوونی سالمی لە ( ١٨٠٠ ) و کۆچی دوواییشی لە ( ١٨٦٦ )دا تۆمار کردووە .

دۆکتۆر احسان فؤاد لەبەرواری ١٠ / ٢ / ١٩٦٩ دا لەنامەیێکی‌دا کەبۆ منی نووسیوە دەلێ : ( بوونی سالم هەروەکوو لەپێشەکەیدا نووسراوە « ١٢٢٠ »ی کۆچی بەرانبەری ( ١٨٠٥ )ی بوونی‌یەو کۆچی دوواییشی ( ١٢٨٦ ) بەرانبەری ١٨٦٩ )ی بوونی‌یە .

« سالم » لەپێش‌دا نازناوی (ڕەنجوور)و جارجارەش (بیمار) بووە بەڵان لەسەر داخوازی دۆستو ئاشناو پزشکان ناز ناوەکانی گۆڕینو کردنیە سالم چونکوو پیاوێکی لەڕو لاوازو بێ تێنو قەنەکێش بووە لەو تاکە هەڵبەستەی‌دا لاوازی وی ئاشکرا دەبێ : -

ئەوەندە چەرخی داوم چەرخی بێ چەرخ سەراپا لاغـرم وەك ڕشتەیی ڕیس



## سالم‌و دلداریتی

سالم لەدڵداریتی‌دا سرشتێکی زۆر تەڕو پاراوو ئاودارو ناسکی وای هەبووە لەسەردەمی خۆی‌و ئێستاش‌دا هاوتای وی کەمن .

سا لەڕووی ئەوەوە کەکاسەی دڵم تەنها بەبادەی کوردو کوردستان پەرستیتی-یەوە پڕو لێو ڕێژە ، جێگای هیچ جۆرە سەوداو ئەڤینی‌یەکی تری تێدا نەبۆتەوەو ناشبێتەوە کەوایە بەشە دڵداریتی‌یەکەی سالمی بۆ ئەوانە بەجێ دێڵم کەلەم پڕۆژە-یەدا یسپۆڕو گراو ( عاشق )و ئاشنای هونەری دڵداریتین ، هەر کەسێکی تەماشای دیوانەکەی سالمی بکات دەزانێ کە ( سالم ) تا چ ئەندازەیێکی لەناخی دەریای دڵداریتی‌دا مەلەوان بووە .

سالم لەکاتی دەربەدەریتی‌و دڵداریتیش‌دا هەستی پاکی کوردایەتی خـۆی هەر دەربڕیوە : -

مەهی فارس زەبانەم گوفت « سالم » شرحی حالەت گۆ

وتم جانا بەڵەد نیم اصطلاحی ئێوە من کوردم

# سالم و هەستی پاکی کوردایەتی

سەردەمێکی کەهەرێمی سلێمانی لەژێر سێبەری داد پەروەرانەی باوك و خاوەندی خۆی دابوو ، کاتێکی خاکی پاکی سلێمانی و شارەزوور لەژێر فەرمانڕەوایی کەس و کاری خۆی دابوو ، چاخێکی میرو خونکارو پادشاو فەرمانڕەوایەکانی کورد بوون ، کاتێکی ئالای کوردان لەسەربان و گردو چیایان بەشنەی بای کوردستان دەشەکا - یەوە : لەلایەن هێمنی و ئارامی و ئاسایشەوە ، لەلایەن ئازادیتی و سەربەخۆیی و بەزم و ڕەزم و ئاهەنگ و سەیران و خۆش گوزەرانی و خۆش ڕابووواردنێوە ، بەتایبەتی لە لایەن ئەوەوە کەهەموو کەسێك خاوەندی ناموس و ئابڕووی خۆیان بون و کەم زۆر ترسی سەرو ماڵ و کیچەڵ و ڕووشەو تەشقەڵەیان نەبوو ! ناتوانم بڵێم وەبەهەشتی دەچوو بەڵکوو پێویستەو جێگای خۆیەتی کەبڵێم بەهەشت وەوێ دەچوو .

بەڵان هەزاران مەخابن کەئالای کوردان خرایە ژێر پێیانەوەو ئالای دوژ - منانیان لەشوێن هەڵکرا ، سەرای ئازادیتی کوردان کاولو دەولـەتی بابانەکان تارو مار کرا ، چەتەو ڕاوو ڕووتکەرەکانی ڕۆمان وەکوو گورگی هار کەوتنــە خاکی پاکی بابانەوە ، دەستیــان بەگرتن و کوژتن و بکرەو بەردەو تاڵان و سووتاندن و خنکاندن و گوللەبارانی کرد ، خانەوادەی پادشایەکانی بابانەکانیــان ئەوانەی مابوون بەدیلی بردیانانە ئەستەنبووڵ و زریك و هۆڕی ژن و منـــداڵی کوردان بەدەست ئەو گورگە خووێن خـۆرو دڕاندانەوە گووێی ئاسمانی کەڕ کردبوو ڕەگ و ڕیشەی هێمنی و ئارامی و ئاسایشی بەجارێکی هەڵکەنرا ، سەرو سامان نەما ، دووکان و بازاڕ سووتا ، کاربەدەستەکانی مـیری کورد گەلێکیان کوژران . . . هەندێکیشیان بەدیل بران ، ئەوانی تریش لەدێهاتاندا خۆیان هاردەوەو خەریکی سەپانی و شووانی و گاوانی و جووتێری بوون .

بەڵێ ئەو خاکەی کەلەسەردەمی ئازادیتی‌دا بەھەشت وەویێ دەچوو لەم دوایی‌یەدا لەدۆژە ( جھنم )ی خراپ تر بەسەرھاتووە . . .

جا بولبولی چارە رِەش کەھێلانەو گوڵو گوڵزاری لێ داغان کرێ و ھاو رِەگەزەکانی بسووتێن چۆن بەچریکە چریك‌و دادو ھاوار ئاگر لـە چەرخ و فەلەك بەنادات !؟!

ھەستیاریش بەبولبولی نیشتمان لەقەڵەم دراوە ، ھەستیارێکی بەچاوی خۆی ئەوھەموو کارەساتانە ببینێ کەبەسەر دەوڵەت‌و گەل‌و نیشتمانەکەی خۆی داھاتوون چۆن دەسرەوێ‌و ئارام دەگری !؟!

سالم بەپێچەوانەی ھۆش‌و بیری نالی‌و کوردی‌و ئەدەب‌و وەفایی‌و . . ئیتر ئاگری تێ بەر ببوو ھەروەکوو لەھەڵبەستە بەرزو ئاسمانیەکانی‌دا دەری بڕیوە بەجوانترین شێوە لەبابەت خـەم‌و خەفەتی تێك چوونی دەوڵەتی بابان‌و سەبارەت بەپەرێشانی‌و بر‌سیەتی‌و دەربەدەریتی و گیران‌و کوژران‌و خنکاندنی کوردان‌و سووتاندنی شارو دێھاتەکانیان قورِێکی وای پێواوە ھەتا ھەتایە ووشك نەبێتەوە .

زۆر موخابینە کەچاپی دیوانی سالم بەو ھەموو ھەستە پاك‌و بەرزانەیەوە بەچەشنێکی وا کەشایانی وی بێ دووای گەلێك بووێژی وا بکەوی کەھەموو چتێکیان لە بیر بووە کوردایەتی نەبێ سەررِای ئەوەش خـۆم بە بەختەوەر دەزانم کەلەپێش مردنمدا توانیم ھەستیارێکی وا بەرزو کوردستان پەرستو یەك رِەنگ بەوێژەوان‌و دڵسۆزانی نەتەوەکەمی بناسێنم .

# شیوەنی سالم بۆ بابانەکان

لێم گەڕێن باگۆشەگیر بم دەستەو ئەژنۆ کەف زەنان
گێژەڵوو کەی بای نەدامەت تاری کرد صفحەی جیهان

صاعقەو بەرقی نحووسەت ظلمەتیدا شرقو غرب
بەردە بارانە بەمخصوصی لەسەر ملکی بەبان

تورکی قورصی خۆر کەطالع بوو طلووعی کرد بەرەقص
کەو کەبەی مـــاهی مرادی ئەهلی بابان بـــوو نیهان

ڕاستە گەردوون چابوکە بۆ ڕەنگی بەد ڕەبطی وەلێ
نارژێنێ ڕەنگێ بەم ڕەنگە لەموددەی سەد قـــرانێ

لەو ساوە حاکمی بەبە گشت دەربەدەر کـــران
نەیدیوە کەس لەچیهرەیێ کەس جەوهەری هونەر

ئەم تاکەی خوارەوەش یەکێکە لەچامەکەی ( سالم )ی کەلەوەلامی ( نالی )دا داناوە هەروەکوو لەلاپەڕەکانی ( ٦٦ - ٦٧ - ٦٨ )یش‌دا چاپکراوە ئەمانەی خوارەوەش هی وی‌یەو مەبەسی لەوەیە کە نالی نەچێتەوە سلێمانی : -

توخوا بلێ بەحضرتی ( نالی ) دەخیلی‌بم — بەم نەوعە قەت نـەکا بەسلیمانیا گوزەر
ئەم ملکە نظمی نابی بەبێ عەدلی وارثی — بێ ئەو بەقصدی ئەم طرفە بازەکا گوزەر
حالم صفت لەبێ کەسی‌یا با نەبێ هیلاك — من کردم‌ئەو نەکا لەغەما خوێنی‌خۆی‌هدر

# هۆی شکستی بابانەکان و سەر کەوتنی رۆمان

لەم هەلبەستانەی خووارەوەی سالمی وا دەردە کەوێ کەهۆی لە ناو چوونی دەوڵەتی بابان‌و سەر کەوتنی ترکان دانیشتوانی شاری بوون :-

لە ئەصلا بانی بی ئەم کارە کاسبهایی شەهری بوون
لە ئەمری فیتنە ئەنگیزا سەرا سەر مثلی مەردانن
لە ئەو ضاعی سلێمانی ئەوانەی شادو ئاسوودەن
لە فەرعا نطفەیی حەیضن لە ئەصلا جنسی‌شەیتانن
گەهێ هەم‌دەردی ئەکرادن گەهی هەم عیشی ئەتراکن
لە یەك لامادەری بەرخن لەیەك لا یـــاری گورگانن
دڵ لەمحنەت کەیلە مەیلی سەیری ناو شارم نیە
عەینی چاوم خووێنی تێزاوە لەداخی مەردومان

# هاوارو دادی سالم لەدەست زۆرو بیدادی ڕۆمیان

کاتێکی شان و شکۆی دەوڵەتی بابانەکان ڕووی لە لێژی و ، ڕۆمیان خاکی پاکی بابانیان چەپەڵ کرد سالم بەشێکی هەلبەستەکانی خۆی کردۆتە ئاوێنەیێکی وا کارەساتی ئەوسامان بەدادو هاوارەوە بۆ دەگێڕێتەوە :-

تابوو بەجایی مطلعی خورشید بەختی رۆم
سووتا گیاە و تەشنەوو خوشکیدە بوو شەجەر
جوز گاهی ئاهوو ناڵە لە ئەیامی رۆمیان
نەمدیوە وا بێ لە فەرری عداڵەت بەنی بەشەر

جێی تر کەکانی ڕۆمە دەرو ژووری خانەقا
غافڵن هەموو لەچاهی مـریدانی با خەبەر
زستانی ئەوڵێن بوو درا بەرگی شێخە باس
ڕۆمی ئەوەندە شووعن لەشخصیش دەخەن زەرەر
تا وەقتێ دوزدی نیمە شەبن ترکی بێ نظام
دوزدن هەموو لەخەرمەنی منعم دەخەن زەرەر
حاکیە ڕۆمی لەسەر تەختی سلیمانی دریغ
کەوتە دەستی دێوی دوون موهری سلیمان ئەلئەمان
سەربلووك لای پشتی گرتو سونگی دەوران هاتە پێش
حەسرەتا باز هەم نەیانزانی نظام وا بێ حەیان
ڕەنگی صحرای محشرێ بوو شیوەکەی لای پیرەمەسوور
گرمەگرمی تۆپی ڕۆمی هەوهەوی سوارەی بەبان



# سالم و کارەساتەکانی بەسەر کوردستانێ داهاتوون

سالم بەدیتنی ئەو هەموو هەنگامەو کارەساتانەی کەلەلایەن ڕۆمیانەوە بەسەر کوردو کوردستانێ داهاتوون کەبرێتی بوون لەسووتاندن و تالآن کردنی شـارو دێهاتان و گرتن و کوژتن و خنکاندن و ئابڕوو بـردن و دیلی ; جەرگ و دلی هەلقرچاوە ئەم هەلبەستانەی خوارەوە لەو بابەتەوە تنۆکێکە لەدەریایێکی شۆرو سۆزو دەروونی وی : -

تا کەن هەوایی هیچ کەبابێ ذەلیلی شەهر
بریانە بەس لەناری غـەما پارەی جیگەر
صەیوان پڕە لەشخصی ستەمدیدە خوارو ژوور
هەر قبری پڕ غەمانە لەهەر لا دەکەم نظر

سوو تا دڵم بەحاڵەتی جۆباری سەرچنار ئێلاوە چەشمەساری وەکو چاوی بێ بصر

وەك چاوی بێ غەمانە هەمو شیوی ئاودار بەس مشکلە لەچەشمەی ئەو قطرە بێتە دەر

ئەوسا مکانی ئاسکە بوو کانی ئاسکان ئێستە لەدەنگو نعرەی ڕۆمی پڕە لەکەر

شارێکی پڕ لەظلمو مکانێکی پڕ لەشین جایێکی پڕ لەشۆرو وولاتێکی پڕ کەسەر

هەمرۆ فضای بازیکەهی جایی ڕەهزەنە لەو دەشتە دێ لەغەیبەوە ئاوازی الحذر

سەربانی پڕ لەگەژدمو دیواری پڕ لەمار کۆلانی پڕ لەڕەهزەنو صحرایی پڕ خطر

بەزمی صیدی ئێمە صیادی فەلەك کارێکی کرد

رەنگە بالای تیر قەددان بێتە ترکیبی کەمان

تابو وطن بەمطلعی خورشیدی بەختی ڕۆم سووتا گیاهو تەشنەو خوشکیدە بوو شجر

هەی خوا ڕۆ لەو دەمە چی کرد تەقەی تۆپو تفەنگ

سەر زەمین تاریكو دونیا تۆزو کەڕ گوێی ئاسمان

ماهی طالع ڕێی محاقو ڕۆژی نەکبەت جیلوە گەر

خەرمەنی شادی لەبەر با بەرقی غەم ئاتەش نشان

ئێشی دەمیان شێلکی تۆپ پشتی سەر ئەو ئاگرە

گەیی یە چەرخی حەوتەمین لەو عانەدا ئاهو فوغان

گووێی فەلەك کەڕ بوو لەبەر نالەی نەفیری ئەهلی شار

لامکانی گرت صەدای ئاهو فـوغان و ئەلئەمان

گەر عەشیرەت گریە کەن هەر بەك هەتا دەمرن کەمە

کوژتنی میر بای مخالف بوو بەشەمی دوژمنان

بوو بەجارووی محلە هـەر طرف پەنجەی پەرێ

پەی کراو بێ پێ لەمەیدان پەهلەوانی پاڵەوان

دە ئەحوالی ئەشخاصی کەخاصی ملکی بابانن

بیدادی فەلەك هەریەك سەراسیمەو هەراسانن

جوانانی سەقەی قەد بەسکی داماون لەبێ چێزی
لەژێر باری غەما هەر یەك لەخەم وامیشلی چەوگانن

لە بابانا گرفتارن پەرێشان خاطر و بێ کەس
بەجەمعیەت سیەه بەختانە وەك گیسوویی خووبانن

لەظلمی چەرخی دوون پەروەر سەخی طبعانی حاتەم دڵ
بە ڕاهی کۆیی دوو نانا لەهەر سوو کاسە گەردانن

بەدەستی کەشە کەش هەرسوو دڕا بەرگی خودا رایی
قەبایی نۆکەرو ئاغا هەمووی بێ چاك و دامانن

دەلەرزن هەوری نوو گەر بێتە ڕووی گەردوون لەپاییزدا
بەڕووتی کۆنە خەز پۆشان لەفیکری بەرگی زستانن

صفی پاشانی باب ئۆغلی لە دێی گۆستەو دەباشانا
بەدەوری گەللەدا چۆماغ دەرکەف جوملە چۆبانن

مریدی خانەقا زۆرن لەعهدی عەدلی ڕۆمی دا
لەئاغایێنی بێ بەش حوجرەها جێی تۆبەکارانن

لەبیمی تازیانەی مەردی ڕۆمی سەییدو سۆفی
بەئومێدی گەزۆو مازوو لەبن داری مەریوانن

---

تکایە بۆ ڕاقەی پتری ئەو کارەساتە جەرگبڕانە تەماشایەکی لاپەڕەکانی
( ١٠٢ تا ١٠٧ ) بفەرموون .

# هـۆی دەربەدەریتی سالم و بەپەریشانی ڕابوواردنی

سالم کەتەماشای کرد لەوە پتر تووانای دیتن و هەلگرتنی ئەو هەموو کارەسات و هەنگامانەی نیە کەتورکان بەسەر خاکی پاکی باباتیان داهێناوە ناچار بەپەریشانی و لی قەوماوی سەری خۆی هەلگرت و ڕووی لەناو خـزمەکانی کوویستانی کرد ·

لەزولمی چەرخی چەپگەردیش دریغا حسرەتا دادا
بەمثلی سالمی بێکەس گەلێ کەس وێلی شارانن

وەبەم شێوەیە مالاوایی دەخووازێ : -

الوداع ئەی ملکی بابان الـوداع الوداع رەیحانی جانان الـــوداع
وەك ئەسیری تورکمان دەمبەن بەزۆر الوداع ئەی شاهی خووبان الوداع

لەم تا کەشی ڕا وادبارە بەقەندیل و لاجانیدا ڕۆیشتووە ، داخەکەم هەر چەندە دوور نیە بەسابلاغی موکریانیدا تێپەڕیبێ و ئیشی نەدووارە : -

شنۆی ئوردی بەهەشتی وەصلی یار ئەر بێ بەسەر مندا
لەلام قەندیل و لاجانە بەهـاوین گەر لەمسقط بم

مرۆڤ کەلەشووێنی خۆی هەلکەنرا تووشی هەزاران تەشقەلەو نەبوونی دێت سالم کەچۆتە تارانیش وەڕەزی خۆی و سەودای نیشتمان ئاوا سەری لێ هەلدەدەن :

لاف خودا ئەم جەژنە بۆ حالی غەریبان ماتەمە
باوجوودی ذموقی مەردوم خاطری من پڕ خەمــە

خۆزگە دەمزانی لە تارانا نەجاتم کەی دەبێ
کۆیی یارە مشهدم یا مدفنم هەر ( ڕەی ) دەبێ

شۆرەزاری خاکی ڕەی ئەمجارە دامەنگیرمە
ڕوو لەهەر وادی دەکەم خاری وەکوو زنجیرمە

لەگەلێ دلێ شەرتە « سالم » گەر نەجانم بوو لەتارانا
بەهەشت ئەر بێتە دەشتی ڕەی بەتارانا گوزەر ناکەم

# دەزانی باغی بەختی...

دەزانی باغی بەختی ئەهلی دڵ بۆ قەت ثەمەر نادا
فەلەك هەرگیز مرادی مەردومی صاحێب هونەر نادا

دەزانی تۆ لە شیشەی دیدە مابی ئەشك ئالوودەم
شەرابی حوب لە جاما ڕەونەقی خووێنی جیگەر نادا

نەكەن تا لەتلەتم بۆسەی نیهانت ڕاستی نالێم
بەلێ قەفقەف هەتا نەی نەیبڕی حاصل شەكەر نادا

لە من دانا نەپرسێ بارەووش هەرگیز لەڕێی عیشقا
بزانی كیمیا هەر كەس سەری ببڕن خەبەر نادا

ڕەگی دڵ دێتە جونبوش گاهی قصدی لێوی مەرجانت
دەلەرزێ دەستی فەصادو نەك ڕێی نێشتەر نادا

لەبی تەشنەی كوهەن زەخمم بەخووێنی نازەگی تەڕ بێ
حەیا بۆ ماهی مەستوورم كەدەستووری نەظەر نادا

لە پایا كۆمەلی لوئلوویی ئەشك ئەگەر تا كەمەر بێنم
ڕەهی دەستی خەیالیشم بە قەدیا وەك كەمەر ناگا

سیەه بەختی جودا ناكا دلی ( سالم ) لە طووڕەی تۆ
بە مەحضی كەشمەكەش سەر روشتەیی ئەم گلوە بەر نادا

---

هەرگیز : هیچ كاتێكی . ڕەه : ڕێ ، ڕێگا . نیهان : پەنهان .
كەشمەكەش : كێشمەكێش . فەصاد : خووێن بەردەر . لەبی تەشنە : لێوی تینوو

# دەکا دونیای پڕ شۆڕش

دەکا دونیای پڕ شۆڕش بە دایم فیتنەها پەیدا
بەنەیرەنگو فسوون هەردەم لەهەر موویێ وەغا پەیدا

تەماشای جەوری دونیا کەن چ قەهرێکی لەخوسرەو گرت
نە بۆ تاجی نیشانێ ما نەبۆ تەختی نیا پەیدا

بە مثلی خوویی مەعشووقە دڵی دونیا لەگەڵ خەڵکی
بە دوژمن نعمت و لطفی جەفای بۆ ئاشنا پەیدا

جیهان گەر ڕوو بەڕووی من بێ بەخووێن ڕێژی ظفر نابا
دەکەم بۆ حیزی جان و دڵ بە چالاکی نیا پەیدا

بەناهم شەهسوارێکە گوزەر کا گەر بە (ئەلبورز)!
دەکا ضربی سمی ئەسپی لە خارا تووتیا پەیدا

بەحوجەت نیزە گەر لێدا سوپەر وەك قاقەزی قەندە
بەهەر ضەربی لەگەڵ بازوویی ئەو حوکمی قضا پەیدا

سفیدەی چاوی بەد خوواهی لە حەسرەت نیزەو دەستی
ضیای دەرعی ئەکا بۆ دوژمنان ڕۆژی سیا پەیدا

لە سامی حەملەیی ئەو بۆ عەدوو هەرجا حەزم/لازم
لە دەس ئەو بوو کراسی ڕۆمیان شێوەی کەوا پەیدا

---

نەیرەنگ ، فێڵ ، لێپ . فسوون : فێڵ . وەغا : شەڕ . نیا : بابیر . حیز : ڕزگاری ؛ خارا : بەردی ڕەق . بازوو : باسك . سفیدەی چاو : سپێنەی چاو . دەرع زرێ ، کراسی ئاسنین . حذر : پارێز ، ترس .

بە تیغی ئەو بە خووێنی رۆمیان شەطی بە رووما دێ
تەنی ئیفتـادە زەورەق سەر لە جێگەی ناخودا پەیدا

لە دەریای مەعرەکەی تیغی نەهەنگی گەر نمایان بێ
لە ناو ئۆردوویێ تورکانا دەبێ شێن و صدا پەیدا

ئەگەر ئاوی بەقای نۆشی بێ دوژمن فالەی نادا
لە مەوجی جەوهەری تیغی حروفی لا بەقا پەیدا

بە ضەربی زەرگی ئەو دوژمن وەکوو پووشە بەدەم باوە
لە میغناتیسی دوور بینی فنونی کارەبـا پـەیـدا

عصای موسایە سەر نێزەی لە رەغمی مشتی فرعەونی
بە بەرقی ئاتەش ئەفشان و بە شکلی ئەژدەها پەیدا

وەلێ طالیع نەبێ پۆشیدەیە جەوهەر لە رووی دونیا
بە مەردانی دلاوەر حاصلی کۆشش جەفا پەیـدا

عزیزە وا لە ناو چاهە خوداوەندا نەجاتی دە
لە چیهرەی ئەو بکا یعقوب دلی شێوەی صفا پەیدا

خودایە ملکی ( بابان ) بێ رەواج و قەلبە سا لطفێ
بە ئیکسیری وجودی ئەو بکا وەك موو بەها پەیدا

---

ناخودا : کەشتیەوان . نومایان بێ : دیار بێ ، خۆ بنوێنێ . مەعرەکە : شەرِگە جەنـگ . مەوج : شەپۆل . ئاوی بەقا : ئاوی زیندەگانی . لا بەقا : نەمـان . مشت : مـست . مشتێ : کەمێك . بەرق : بروسك . ئاتەش ئەفشان : ئاگر پژێن ئەژدەها : هەژدیها . چیهرە : روو .

# لە ڕازی دڵ ئەگەر . . .

لــە ڕازی دڵ ئەگەر تێرت خەبەردا دەدەی دەستی نیگارینت بە ســەردا
شەتی خوێن دێ بەڕووما لەتلەتی جەرگ دەبێ ڕەنگەی پلووسکی دیدە بــەر دا
قبول نابێ حەجی کەعبەی ویصــالت ئەگەر دڵ حەلقەیی ئەو زولفە بەر دا
ئــەوەند عقدەی نیهانم کەوتە ناو دڵ دەترسم مــایەیی ئــەم دەردە دەردا
لە جێی تیرت دڵم دەردێ لــە سینەم بە استقبالی تــۆ گەر بێی لە دەردا
دەڵێم وەك قامەتت دڵگیرە ســەرویش ئەگەر سێب و گوڵێ سونبول ئەمەر دا
لە بیمی جــەورو ئومێدی تەڕەحوم دەلــەرزی دڵ لــە حــالاتی نظر دا
ڕەوانم بێ نیثــاری بــەرقی شمشێر ئەگەر بۆ کوژتنی ( ســالم ) خــەبەر دا



# حیکایەت خووانە تووتی دڵ

حیکایەت خووانە تووتی دڵ بە دەورەی دامی گێسوو دا
مظنە عەکسی خــۆی دیوە لــە ناو ئاوێنــەیی ڕوو دا

لە بت بوو دارِوویی جێ نێشی ماری عقرەبت نەتــدا
هەتا لەمرم بە حەسرەت با بــدەم دەستم بــە زانوو دا

تەمام بوو حەلقە، کەم دەستم لە قەددت زولفت ئالۆزا
نیهان بوو مطلبم وا کەوتە سەر یەك موو بەسەر موودا

---

نیگار : نەخش ، دۆست . نیهان : پەنهان ، نەدیو . سێب : سێو ، سونبول : گواڵەکەنمو گیتر ، جوورە گولێکیشە لەپێش نەورۆزیدا پەیدا دەبێ . سینە : سینگ . بیم : ترس . نیثار : شاباش . گێسوو : پرچ . زانوو : ئەژنۆ ، چۆك

دڵی تووتی لە پەروازا لە سەر گوڵ لەنگەری راگرت
کە یاری شۆخ و شیرینم سەحەر وەسمەی لە ئەبرۆدا
طەلەبکارم بدا روتبەم بسە دامەن بۆسەیی خاڵـــت
شەهەنشـاهی کە شاهی کیشوەری رۆمی بە هیندوو دا
لە صدقم شانەو و بادی سەحەر گەهە شاهدن هەردوو
غوباری طوررەیی مشکینی تۆ نافەی بسە ئاهوو دا
لە عەهدی دیدەیی یارا دڵ و صیحەت گەلی ضیدن
بە (سالم) کەی دەمێنی باز ئەگەر چنگی لە تەیهوو دا



## دلم شادە ....

دڵم شادە لە بەندی سیلسیلەی گیسووی دولبەر دا
لە شانە خەوفنا کە دەفعەیی لەم داوە دڵبـەر دا

لە دونیا دا دلم گەر تەرکی طوررەی تۆ نەکا سەهلە
بڕوون نایە لە شۆر و زەمزەمە و غەوغایی مەحشەر دا

بەسەر سەرتا بپێکی چەتری تاووسی ئەگەر طوررەت
دەکا بیروون لە ئەرقی پادشەهـ زینەت لە ئەفسەر دا

گرەی بەست دڵ لە سینەم دا لەحەسرەت سەردی میهری تۆ
کە حەتتا ئاگری بڕ گڕ دەسووتێنێ لە مەجمـــەر دا

---

وەسمە دەرمانێکی رەشی برۆیانە شین دەنووێنێ ژنان لە برۆی خۆیانی دەدەن. ئەبرۆ : برۆ . غوبار : تۆز . نافە : ناووك . ئاهوو : ئاسك . مشكین : بۆنخۆش مشك : ماكێكی بۆنخۆشە لە ناوكی جۆرە ئاسكێكی پەیدا دەبێ كە بەزۆرتربن لە چیایەكانی هیمالایە دان . بیرون نایە : نایەتە دەر . ئەفسەر : تاج . فەرق : سەر

تحمل که زەمانی کوژتنی مــــن سرعەتی ناوێ
لە دڵمایە بگیرم خۆم بـە دەوری دەست و خـەنجەردا
ئەفەرهاد کەوتە شۆری من ئەشیرین کەیی یە ووتبەی تـۆ
نیـە رەحمت بـە «سالم» دا واویش لە تـۆ بــەردا



## طەریقی عیشقت . . .

طەریقی عیشقت ئەگەر بەردەم خەجاڵەت بـم لە مەحشەردا
ئەنووسرابم لە پیتا گەر ئەزەل حەك بم لە دەفتــەر دا
قبوولێ ناکەم خەیاڵیشت لـە ناو دڵــدا مقیمی بێ
ئەوا پەژموردە بێ گوڵدەستەیی حوسنت لـە مجمر دا
لە دەستم بەر مەدە دامـەن مەبادا بمكوژێ هیجرت
مەبادا خوێنی ناحەق دامەنت بگرێ لـە مەحشەر دا
تەوانایی بـەسەر ضعفا دەبی فــائق ئەگەر گاهێ
سەبا بێنێ سحر بۆی تــۆ بەسەر مندا لەدەم دەردا
حەڵاوەت تا قیـامەت نابڕێ (سالم) لەناو دەما
ئەگەر نەخلی مرادم دەفعەیەك بۆسە نەو بــەر دا



## زولفی جانانە لە دەوری کەمەرا

زولفی جانانە لـە دەوری کەمــەرا وەك سیەه مــارە بە قەد نەیشەکەرا
دەوری ڕووی داوە خەمی سنبلی موو هـەروەکوو هـالە لـە دەوری قەمــەرا

---

شۆر : هەرا ، پشێوی . ئـــەوا : ئەوەکوو . پەژموردە : ژاکاو ، گـەچراو . مەجمەر : مەقەلی . بۆسە : ماچ . نەوبەر : نۆبەرە . هالە : خەرمانەی دەورەی مانگ و ڕۆژ . نەیشەکەر : قامیشی شەکری .

| | |
|---|---|
| تیری تۆ ڕەنگە لە سینەم بڕوێ | غەرقی پێکانــە لە ڕیشەی جگەرا |
| گەردن ئارایشە بەو طورڕەی تۆ | شەبە خۆش ڕەنگە لەپەهلووی کەمەرا |
| دەبمە ئەو ئاشە کە ئاوی ببڕن | شۆری عەشقم کە نەمێنێ لە سـەرا |
| لە هەناسەی منی مەظلومی غەریب | خۆت بپارێزە لە وەختی سەحەرا |
| حورمەتی تۆ لە زەمانەی (سالم) | هەر وەکو دینە لە عەهدی عومەرا |



## پڕ چینە زولفی پڕ خەم...

پڕ چینە زولفی پڕ خەم نەقشە لە ڕوویی یارا
وەك میللەتی مەجووسی هەردێن بە دەوری نارا
طورڕەت کە دێ بە ڕوودا وەك عینی کوفری حوسنە
بۆ ڕەونـەقی کلیسـا با هــەر ببن نصـارا
غەمزەت لە تیرە باران زولفت دڵی پـەنا دا
بەم ڕەنگە حوسنی ئەخلاق کێ دی لە جنسی مارا
مەی، گەر حەرام و تاڵە ساقی بە چاوی مەستت
أشهی لنا واحلی من قبـلة العـذارا
ئەی ئەو کەسەی کە شەو هات یادت ئەنیسی دڵە
یەك لەحظە دێمە یادت داخوا لە ڕۆژگارا
تۆ ناتەوان و مسکین دوژمن قەوی و بێ دین
(سالم) لە عەهدی ئەو دا کووا چارە جوز مودارا

---

پێکان: ئەنگیوران. ئارایش: ڕازانەوە. شۆر: سۆز، هەوا.

# « لەسەر هەلبەستی حافظ »

ئەگەر ئومێدی دڵ بێنێتە جێ ماهي جیهان ئارا
بەخالی هیندوەش بەخشم سەمەرقەندو بوخارا را

لەبن خاری موغیلان وصل ئەگەر بێ ئارەزوو ناکەم
کەناري ئابي ڕوکنـاـبادو گوڵگەشتي مـوصەلارا

لەعەزمم لانەدا فەوتام بەتاڵان چـوو سـەرو مـاڵم
چونان بوردەند صەبر ئەز دڵ کي تورکان خواني یەغمارا

نـەصیحەت بگرە گووێ جانا لەلایـان زۆر بەتەعظیمە
جەوانانی سـەعادەتمەند پـەندی پـــیري دانارا

دووسەد جار گەر بەگوێی خۆم حەرفي ساردت بشنەوم شادم
جــەوابي تـەلـخ میزیبــەد لەبي لەعلی شــەکەر خـــارا

ئەگەر حۆری لەکەوثـەر شوستوشۆي خۆیدا بەتۆ نابێ
بەئاب‌و ڕەنگ‌و خاڵ‌و خەت چەحاجەت رووي زیبا را

لەئیـدراکی شکەنج و عــوقدەیی زولفت پـەرێشانــم
کی کەس نەگوشودو نەگوشایەد بەحیکمەت ئین موعەممارا

کەشوعلەي طەلعەتی یوسف طلوعی کرد بەچی زانیـم
کەعیشق ئەز پەردەیی عیصمەت بیرون ئارەد زولەیخا را

کەلامت ( حافظ )ا دڵسەنجە بۆ ( سالم ) وەها چاکە
کی بەر نەظمي تو ئەفشانەد فەلەك عقدي ثـورە یـا را

---

ئارا : رازێنەوە . خـار : دڕوو . خـوانی یەغما : سفرەی تالانی . بشنەووم : بیبەم . میزیبەد . شایانە . شەکەرخار : شەکرخۆر . شوست‌و شۆ : شوشتن . زیبا : جووان . شکەنج : پێچ‌و تاو . عیصمەت : ئابڕوومەندی . دڵسەنجە : دڵگرە .

کشا یەکسوو بەگۆشەی روویی یارا — چ جنسێ بێ لە مارا بێ بە نارا
خەزانی رەنگی من بۆ ئاینەی رووت — خەزانم دی لە ئاغۆشی بەهارا
تەزەرووی دڵ دەخوازی بازی چاوت — کە گەردش کا لە طەیرانی شکارا
بەتەحصیل مەطلەبی چەندی بە رێ دا — کە بگری دامەنی دارا نەدارا
دەسا چۆن دامەنت بگرم کە مەیلت — ئەوەند ساردە ئەما پەنجەم لە کارا
سەری تەسلیمی داوە نێرگسی مەست — بەدیدەی تۆ لە هەنگامی خومارا
لەئەشکی سوورو سوویری خۆم دەبینم — گولستانێ لە خاکی شۆرە زارا
دڵی دلبەر کە مائل بێ بە ئەغیار — نیە تەدبیری ( سالم ) جوز مودارا



## دەستی من تەعویزە . . .

دەستی من تەعویزە بۆ رەدی بەلا — با حەمایەل بێ لە ملتا بێلەسا
نیسبەتی رووم‌دا بەگوڵ گیسووی بەمشك — سەهوە حەرفی ئەوەلم ثانی خەتا
دڵ بەنا دیدەت لەجێی دڵ چی بەرێ — کا نەکێشێ چی بکێشێ کارەبا
گەر بزانی جەوری حالی ئیحتیاج — دەستی رِوو نانێتە بەر سینەی گەدا
سەر بەسەر پێچیدە بوو تۆماری عمر — شەرحی عیشقە ئیبتیدا تا ئینتیها

زەررِە سا ئەعضای ( سالم ) دێتە رەقص
هەر سەحەر میهری روخت پرِتەو دەخا

---

یەکسوو : لایەك . خەزان : پاییز . ئاغوش : باوەش . تەزەروو : کەلەبابی کێوی . گەردش : گەران . شکار : راو . دارا : دەهەبوو ، دەولەمەند . نەبوو : هەژار . هەنگام : کات . خومار : مەستی . شورەزار : شۆرە کات . جوز : بێجگە . تعویز : نشتوو . پێچیدە : پێچراوەوە . زەرەسا : وەکوو ئاستەم . میهر : خۆر . پرِتەو دەخا : دەدرەوشێ .

سونبولی طورڕە کە پەرژینە بە پەهلوویی گولا
موو بەموو هەر یێکە داوێکە لە ڕێی مورغی دلا
رەوشەنی داوە بە دلّ رەوزەنی سینەم لە خەدەنگ
دەك ئیلاهی نەڕزێ دەستی کەمـانت لە کلا
سیرڕی نیکتەی دەهەنت چاکە نەزانی قەنـاد
نمەك ئاالوودە نەکەن با لە خەمـیری نوقلا
گەر لە ڕووی گولّ دلّی من شادە بەبێ خەندەیی تۆ
با بدا دەستی قضا مەردوومی دیدەم بـــە چلا
یار گلەی بوو لە دلم چونکە نەسووتا لە فراق
لە قسەی ناحەقی ئەو ( سالم ) ی مسکین خەجلا



شەڕیە لە سەر ئەندێشەیی ئەو مؤمین و تەرسا
کێشاویە لە سەر مەسحەفی روو شکلی چەلیپـا
ئەم کێشە کە گیسووت هەیەتی کامی کەشیشە؟
بگرن بە جەدەل با عولەمـا ریشی سکوبـا
جێی هیندوویی خالّت نیە خورشیدی جەمالّت
ئەم مەرتەبەیـە قابلە بۆ حەضرەتی عیسا
هەرچی نیەتت بوو نیـکەهت دلی بەلەد کرد
هەرچی نیەتم بوو بە موژەت دلّ خەبەری دا
مەجنوون غەمی کووا پردی صیراط هەر وەکوو مووبێ
دەیـکێشێ لە وێشا کەششی طوڕڕەیی لەیلا

---

طوڕڕە : لز گە موویە کی تاو دراوە بە کەناری ناوچاوانێ دا. پەهلوو : تەنیشت .
مورغ : بالندە . رەوزەن : کولانە . سینە : سنـگ . خەدەنـگ : تیر .
کەمان : کەوان . دەهەن : زار . نمەك خووێ . ئاالوودە : تێـکالّ .
مەردوومی دیدە : گلێنەی چاو . خەمیر : هەویر . نیـکەهـ : ڕووانین .

غولامی دیدەیی مەخموری تۆیـە نێرگسی شـەهلا
لە ئابو تابی ڕووی تۆ داغدارە لالەیی حـــەمرا
بەیاضی ناصیەی تۆ بوو سفیدی دا بەصوبحی عیـد
لەنوسخەی قیرگۆن زولفت سیاهی برد شەوی یەلدا
عەقیم ئـاسا لەزگ وەستایـەوە حەملی نەما ئیتر
لەپاش تـۆ دایەیی دونیـا بەمثلی مـادەری عیسـا
لە قوببەی نووری پوستانت یەدی بەیضا نموودارە
ئەبەد ناگاتە دو گمەی جێبی جامەی تۆ کەفی موسا
خەزانی ڕەنگ زەردم باعثی نـەشوو نمای تۆیـــە
سیاهی ڕۆژی مەجنون سورمەیە بـۆ دیدەیی لەیلا
لە صیحەی هاتە لەرزش قەلبی گاوی ژێر زەمین ئەمشەو
دڵی کەیوان لـە ئاهی من لـە هەفتەم ئاسمان سووتـــا
دوو سەد جار وەضعی چەرخی ئاسمان گۆڕا بەسەعدو شووم
ستارەی نەحسی « سالم » بوو لـە قەرنێکا نـەبوو ئـــاوا



## مایلە وەك سەری زولفت

مایلە وەك سەری زولفت سەری من بۆ بەری پا
بە جەفا مەیخەرە لا سا صەنەما تـۆیی خـــودا
زیوەری حوسنی دلآرامە سەوادی خەمی زولف
نانووێنی کەنەبێ ظولمەتی شـەو شەوقی چـــرا

---

شەهلا : ڕەشێکە شین بنوێنێ . ئابو تاب : ئاوو تاو . موژە : مژۆڵ . مەخمور : مەست . ناصیە : نێو چـاوان . قیرگۆن : ڕەنگ قیر . عقیم ئاسا : وەکوو نەزۆك یەلدا : درێژترین شەوێکە دەکەوێتە دووایی پاییزو سەرەتای زستانەوە زیوەر : خشڵ . سەواد : ڕەشایی ، ڕەشانکی .

عوزری مەسموعە عبادەت نیە گەر عادەتی ئەو
پێی نیگارینی لە بەندایە بە زنجیری حەیا
عەجەب ئاهیستە خەرامێ بە طەرەف ئێمەوە با
بارە بۆ پەنجەیی پێی نازکی تۆ رەنگی حەنا
بۆیە ئەز بەسکی نزارم لە فیراقی مەهی رووت
وەکوو ئەبرۆیی هیلالت قەدم ئەنگوشت نما
میهری جانانە هوویدایە لەسەر خاکی لەحەد
لە موقابیل دڵی (سالم) دەڕوویێ میهری گیا



بە محضی جەوری دولبەر هەر کەسێ تەرکی محبەت کا
لە قەبریشا بە محنەت تا قیـــامەت گریە عادەت کا
قبووڵ ناکا بێ غەیرەز پەریشـــانی لە عالەم دا
نەلەك گەر پەیرەوی کرداری یاری بێ مروەت کا
لە بێ انصافیـا تـەکوژێ بـە ئیما سەیدی خاوت
بە مضمونی عفو گەر نامەیی قابض بە حجت کا
دەزانی چۆن فەرەحناکم بە بۆسەی لێوی شیرینت
بە موفلیس مەردی منعم وەك صدا بۆ خووانی نعمت کا
بە محضی کەشمەکەش دامانی عیشقێ بەربدەم نابێ
دەمی تیغی مصیبت گەر کەفی فیکرم هەموو لەت کا
سەراسەر کاری (سالم) عیشقی تۆیە ئەوەل و ئاخر
خەجاڵەت بێ قیامەت گەر بەبێ تۆ مەیلی جنت کا

---

ئاهیستە: لەسەرەخۆ. خەرام: بە ناز رۆیشتن. نیگار: دوست، نەخش، بوت.
ئەز بەسکی: لە بەر ئەوەی. نزار: بێ تین. ئەنگوشت نما: بە قامك نیشاندان.
میهر: خۆشەویستی. جانانە: دۆست، یار. هوویدا: ئاشکرا. لحد: گۆڕیچە.
خووان: سفرە. کەف: لەپی دەست. ئیما: ڕیك (اشارة)، چاو هەڵتەکاندن.

کاتبی فیکرم لە دڵدا دقتی انشا دەکا
جوست و جۆ بۆ سطر بەندی کاغەزی میرزا دەکا

تا کوو بێتە سەر سەری سایەی هوما ئاوا ئەبێ
لووتی پاپاخی لە گەڵ سقفی فەلەك دەعوا دەکا

بۆ ڕێگا گەر ساقی عوجیان کردە پردی ئاوی نیل
استیخوانی دەستی میرزا پول لە سەریا دەریا دەکا

گەر لەلای زەوجەی لەشەو دابێت و هەڵسێ بۆ عمل
قیامەتی مەیلی لە دەرگانەی حەرەم بەرپا دەکا

ئەمرەقە لەقلەق ئەگەر ترکیبی نسبت کا بە تۆ
حوشتر ئەر بیت و بڵێ وەك تۆ ئەڕۆم بی چا دەکا

* * *

چاوەکەت وەختێ بە ئیما مەیلی جامی مەی دەکا
هەرچی مەی دەیکا لە گەڵ ئەو ئەو لە گەڵ ئێمەی دەکا

نەی لە ناڵینا چ گوستاخانە بۆ ئەربابی سەمع
باسی ئەیامی گوزەشتەی کەیقوباد و کەی دەکا

تا سوپاهی خوسرەوی عەشقت ئیحاطەی جانی دا
بۆ شەڕو شۆڕی مصیبت دڵ لەملکی رەی دەکا

کاروان ئەر سست ڕۆبی تا دەگاتە کۆیی لەیل
شەوقی بێ پایانی دڵ ووشتر بە مەجنون پەی دەکا

حاڵی عیشق و تابشی هیجرت نیشانی دا بە من
ئاگری سۆزندە هەر کارێ بەپێشەی نەی دەکا

تا بەسەر باغی دڵا بێ بای خەزانی فیرقەتت
عارضم بۆ سێوی ڕوخسارت لە ڕەنگی بەی دەکا

جورعەنۆشی تۆ بکەم ئیتر لە بەزمی مەیکەدە
چاوی مەخمورت بە عاشق کاری بادەی مەی دەکا

جوستوجۆ : تەقەلا . پاپاخ : جووورە کڵاوێکی کولکنی ڕەشی عەجەمانە .
نەی : بلوێر . گوستاخانە : بێ باکانە . ڕەی : هەرێمێکە لە نزیك تاران .
کۆی : کۆڵان . تابش : تین ، تاو . سۆزندە : سووتێنەر پێشەی نەی :
پیشەی قامیشەڵان .

وەختی بەخشش بـۆ بنووسم داستانی هیمەتت
مەردی دانا وەصفی جودی حاتەمی طەی کەی دەکا
ئابلەی دەردا کەفی بێی تاقەتی هەنگامی جـەمد
( سالـی ) سەر گەشتە ئەر بەس رێی مصیبت طەی دەکا

فەلەك زەحمەت لە دڵ مەیلت بەدەر کا | بینای هەستیم ئەگەر زێرو زەبەر کا
تەلاشی عەشقی بی هەر کەس لە دڵدا | دەبێ سینەی سوپەر بێو تەر کی سەر کا
کە سولطانی خەیاڵت بێتە خاطــر | دەبێ شاهی خیرەد مەیلی سەفەر کا
دەڵێی بارامی گۆرە تور کی چاوت | لە دڵ نەمدیوە قەت تیری خەطەر کا
مەتاعی خانە پایــەنــدازی غەمزەت | ئەگەر بۆ شاهراهی دڵ گوزەر کا
دەنێمە ظەرفی خاطــر یادی بۆسەت | ئەگەر طەبعم تەمەنای گولشەکەر کا
پەرێشـانم دەکا وەك مڵکی بێ شاه | لە قامەت هەر سەحەر گێسوو کەمەر کا
حەڵاڵی کرد بە مەردوم دڵ لە قورِ با | نەظەر کا غەمزەت ئەرخووێنی هەدەر کا
ویصـالت پایەیی میعراجە بۆ مـن | لە رووتا گەر لەبم شەق القەمەر کا
دەسا تەسخیری دڵ چاوت بـە ئیمـا | سەرا سەر اسمی اعظم گەر لەبەر کا
بە دڵ وابگرە دڵ تیرێ لە غەمزەت | لەموهرەی پشتی ( سالم ) سەر بەدەر کا



تور کی پرِ ئەفسوونی چاوی کاری سەد جادوو دەکا
ساعەتاً تەسخیر ئەبێ بۆ هەر مەکانێ رەو دەکا
هەرچی نادر قەبض و بەسطی کرد بە شمشیر و سوپا
ئەم بە تیغی جەوهەر ئالوودەی خەمی ئەبرۆ دەکا

سەر گەشتە : سەر گەردان . تەلاش : خەبات . سوپەر : مەتاڵ . خیرەد : هۆش ، (عقل) . شا ڕا شەقام . روخ : ڕوو . خەمی ئەبرۆ : کەچی برۆ .

خالی سەر صفحەی رِوخی جانا چ نادر کەوتووە
حیکمەتی دار الخلافەی گورجیان هێندوو دەکا
رِیشوەیی گەردن کەچی ئەو گەردەنە حوکمی قضـا
بۆ خەراجی بەندەگی سەرگەردەنی ئاهوو دەکا
ئێستە بۆ مەللاحی دەریای عیشق و ئەهلی معرفت
قطرە قطرە ئەشکی چـاوم قیمەتی لوء لوء دەکا
سەهلە گەر مووسا عەصای کردە حەی و سەهمی نووانە
موعجیزەی دا دولبەرم هەردەم بە مووی گیسوو دەکا
رِوویی دونیـا تارە تا شەممی جەبینی دوورە لێم
ناصیەی پرِ چینی من دایم هـەوای زانـوو دەکا
گەر بە موژدەی مەرحەمەت جانی رِەقیبم تازە کەی
میثلی طیفلی موردە مادەر دڵ بەشیوەن خەو دەکا
لیسەی هو حەقە لە رِێی حەق دەستی رەددم لێ مەدەن
( سالم )ی مسکین وەکوو دەروێش لەدەرگەت هوو دەکا



غەم لە دڵ بۆ نەوتنی شادی مەیلی سەرخۆشی دەکا
صبحی عیشقە شەممی عەقلم رِوو لـە خامۆشی دەکا
زولفی شەبرِەنگت وەکوو رِۆژە پەرێشان با نەبێ
وا سەحاب ئاسا لە رِووتا قەصدی مەهپۆشی دەکا
بۆ ئەدایی تەعزیەی مـن تورکی چاوی مەستی یار
پرِ طەرەب هەردەم لە بەزمی عیشوە مەی نۆشی دەکا

---

رِوخ : رِوو . خەراج : باج . ئاهوو : ئاسك . ئەشك : فرمێسك . حەی : مار . ناصیە : ناو چاوان . زانوو : چۆك . موردەمادەر : دایك مردوو . مەهپۆشی : بەری مانگ گرتن . عیشوە : ناز .

داستانی عیشقی من فاشە لە هەر کووچەو سوقاق
عقلی دێوانەم لەپاش ئەم حاڵە سرپۆشی دەکا
کەثرەتی ضیعفم لە هیجرانا گەیشتە مەرکەزێ
دڵ لە سینەم‌دا بەدایم مەشقی بێ هۆشی دەکا
دولبەری باڵا بڵندم گەر خەرامان بێ بە ناز
سەروی گوڵزاری ئیرەم چۆن مەیلی هەمدۆشی دەکا
گەر نەوێرێ ڕێی سەگی قاپیت بەرن بۆ جێی غەریب
(سالم)ی مسکین لە دەرگا حەلقە دەرگۆشی دەکا



بێ تەماشای خاڵی تۆ خاڵێ لە مەردوم دیدە ما
عەکسی ئەو بۆ مەردومی دانا لە پەردەی دیدە ما
شوعلە نەیدا فرصەتی پەروانە مطلب کا بەیان
سیرڕی سەربەستەی لەبی شەمعا هەموو پۆشیدە ما
وا نەبوو لێوت بە سروەی بای خەیاڵی بۆسەیێ
غونچەیی سێرابی نەشکوفتەت چوو ناچیدە ما
ڕوویی وەك لالەت لە خەشمایەك نیکەهە ڕەنگێکی ڕیت
داغی حەسرەت تا قیامەت بۆ دڵی ڕەنجیدە ما
تا دەڵێم مروەتکە رەحمی جەوری تۆ ئەفزوون دەبێ
دادو بێدادم لە کووێتا هەروەها نەشنیدە ما
کووا تەرازوویێ قیاسی وەزنی حوبی پێ بکەم
میهری سەنگینت لە کەفەی دڵ بە ناسەنجیدە ما

---

فاش : ئاشکرا . خەرامان : لەنجەولار . هەمدۆشی : هاوشانی . سیراب : تێراو . نەشکوفتە : نەپشکووتوو . نیکەهە : ڕووانین . ئەفزوون : پتر . کەفە : لنکە تەرازوو . نەشنیدە : نەبیستراو . ناسەنجیدە : نەکیشراو ، هەڵنەسەنگێنراو .

نەظمی شایانی لەکووێ بوو عاشقی شۆریدە بەخت
مووبی ئاشوفتەی سەرم وا دەرهەم و ژۆلیدە ما
تابی بێ میهری نەبوو یەکدەم وەکوو « سالم » ڕەقیب
سەگ بەتۆپێن چوو لە قەحطا گورگی باران دیدە ما



شەتی ئەشکم دەبی هەر بێ بەڕووما — هەتا بێ بەحری ئاق دنگز بەڕۆما
دەزانی چۆنە ئەحوالّم لە هیجرت — وەکوو تەشنەم لە ناو بەحری زقووما
لە پیریش‌دا عەروسی یادی وەصلت — بیروون نایە لە پەردەی ئارەزووما
دەمی وەصفی دەمی تیغت دەلەرزم — ئەڕەستوو بم لە ئیدراکی علووما
لە کوورەی دلّ بیرون دێ ئاهی سەردم — عەجەب یەخ بێ لەناو چاهی سمووما
تەجاوز کەی دەکا « سالم » لەئەمرت — کەسێ نەیدیوە ڕوو سەختی لە مووما



وەکوو فووارە خووێن دەکولێ دەمی ئاهم لەحولقووما
بە دلّ پەیوەستەیە سووراخی پەیکانت لە پەهلووما
مەگەر وەختێ لەسەیری خالّی چیهرەت دیدە فارغ بێ
سیاهی مەردومەك بتکێ لەگەلّ ئەشکم بەسەر ڕووما
لە هیجریشا مصیبەت نایەلێ سەر هەلّبڕم یەك دەم
لە خووێنی ئەشکما چەسپاوە پێشانی بە زانووما
لەسەر ڕوو لادە تاری طوورەیی مشکینی تاتارت
حەبەش دەستی تەطاول با نەکێشی بابەسەر ڕووما
ئەگەرچی کاری بە دەردم وەلێ نەزدیکە تەسکینم
بیرژێنی حەکیم گەر ئارەقی چیهرەت بە داڕووما
بە مشاطەی دەووت دولبەر دلّی سالم مەڕەنجێنە
لە ناو جمعی پەرێشانا لە حەلقەی چینی گیسووما

گەر بەبۆ نسبەتی طورەت بدەمە مشکی خطا  بۆ خەطا فخرە بەسا بۆ منە بەس خبطو خطا
شێوەیی ئەبرویی تاقت هەمە جـا دێتە نظر  دە گەرێ دڵ بەطرف تۆوە وەکو قیبلە نما
کەی بەچەنگالی هەڵۆی غـەم  دەکەوێ طائری دڵ
تا لەزاغی خەمی زولفت هەیەتی ظیللی هومـا
أبداً ڕەنگی عدم نایەتە ڕوی کوشتەی عشق  بەدەمی تیغی ستەمدا دەڕژی ئاوی بەقـا
لەدوولا زولف بەلا جۆ گە بەلا دەنووێنی  نەفی مانەندی لطیفی ڕوخی جانانە دەکا
کەی لەبەرطورەدەگا دەستی خیالم بەڕوخت  تۆ نەبی کێیە بکا دەستەیی سونبول بەقلا
مورغی پڕ وەحشتی دڵ ئەوشەوە ئەمنیتی بو  لەڕوخ و طرەی تۆ دەردەکەوێ دامی چرا
نقدی جان و دڵ و دین پێشکەشی یەك نیگەهت  گەر قبول کەی لەمنی سوختەدڵ ڕووی نما
وەرەسا بەنجەلەخوێنی دڵی سالم بکەڕەنگ  ثبتە ئەم ڕەنگە بەدایم نیەوەك ڕەنگی حەنا



هەر سەحەر دێنێتە یادم کۆیی تۆ مڵکی خەتا
نەفحە ها دێنێ لەمشکین زولفی تۆ بادی صبا
نەهری ئەشك ئەمشەو لە دیدەم وا بەخوڕ دەڕژێتە ڕوو
دڵ لەسینەم تا سەحـەر سەنگ ئاسیا ئاسـا گەڕا
بەسکی هـەر جا کوشتەیی تیغی محبت کەوتوون
کۆی دلآرامم لەخووێنا بوو بە دەشتی کەربـەلا
چەسپە هەر جا ڕیشەیی جەرگم لە گەڵ ڕیشەی خەدەنگ
چەند بەچوستی تـیری موژگانت لەناو دڵا ڕووا
نانووێنێ بێ بەسەرمـا گەر مصیبەتهای چـەرخ
تالەسەر سەرمە لە سایەی زولفی تـۆ باڵی هـوما
بێتو سەیری حوسنی زولفت کا لەدەورەی عارضت
هەر کەسێ نەیدیوە تاریکی لەبەر شەوقی چـرا

---

بەسا : زۆر . ڕوخ : ڕوو . دام . داو . نەفحەها : بۆیانی بۆنخۆش . ئەشك : فرمێسك . دیدە : چاو . سەنگ ئاسیا ئاسا : وەکوو بەرداش .

من دەمێکە خۆ لەخووی یاری قەدیمم شارەزام
دوژمنی یارانی دێرینەو بە دوژمن ئاشنـا
غەرقی بەحری فیکرە «سالم» دەست و پای جەهدی نیە
قەت شەنا ناکا لە دەریادا کەسێ بێ دەست و پا

---

ساقی لەپەردە دەرهات جامی شرابی هێنا دڵ خیرە ما لە حیرەت مەه ئافتابی هێنا
یەك زەرە عەکسی پرتەو دەر کەوتو طوری سووتاند
ئاینە سەخت ڕوو بوو لەو عەکسە تابی هێنا
تیماری چاکی سینەم راجع بەچاوی مەستە بەختیش موافقی عیشق بۆ من خرابی هێنا
یارم لەاندرون هات دەستی ڕقیب لەدەستا غەمناکو شادمانم رەحمەت عەزابی هێنا
بۆ تۆبە سوویی مسجد هاتم بچم لەڕێدا بۆ کۆیی مەیفرۆشان عەزمم شتابی هێنا
ڕوی هەرلەمن دەپۆشی واحالیە کەجبریل هەرخاصە بۆ من و ئەو ئایەی حیجابی هێنا
وەی وەی چ مجلیسێ بو دوینێ لەدیدەودڵ دولبەر شەڕابی گێڕا «سالم» کەبابی هێنا

---

لە عەرصەی ئەوجی عەشقەت بازی دڵ هەڵسا لەدەورانا
بە بەرقی پرتەوی حوسنت پەڕی سووتا لە طەیرانا
لە ڕۆژی امتحانا دیم بەرابەر طالب و معشووق
کەمەر بەستەی هونەر هاتن لە تیپی عیشق بازانا
لە یەك لا «نالی و مشوی» لەلایێ «سالم و کوردی»
لەهەنگامەی هونەر گەرمی تکا چۆ بوون لە «مەولانا»
لە مەیدانی بەلاغەتدا بە سوواری مەر کەبی مضمون
بە کوردی هەریە کە تازی سوواریێ بوون لە(بابا)نا
کە (نالی) تەوسەنی طبعی بە تەرزی گەرم جەستەن بوو
بە چەوگانی خیرەد گۆی دانشی دەر کرد لە مەیدانـا
کە ڕەختی طبعی ڕامی هاتە سەر میقراضەکەی تعلیم
ر کابی بابی بۆسی «سالم»و مەشوی لە دەورانـا

---

شەنا : مەلە. خیرە : واق وڕی. مەه ئافتابی هێنا : مانگ ڕۆژی هێنا. پرتەو : تیشك. چاك : دڕاو. لەاندروون : ژوورەوە. شتاب : تالووکە.

بەدەل کەین «*» با بەنەشئەی مەی خوماری محنەتی دونیا
ئــــەلا یا ایها الساقی أدر کأسا و ناولهـــــــا

محبت زۆر بە ئاشووبە بەسەھلی تێ مەگەن یـــاران
کی عیشق ئاسان بووەد ئەوەل وەنێ افتادە مشکلها

کەبادی صبحدەم ئەفشان ئەکا گیسوویی پــڕ چینی
زوتابی جوعدی مشکینەش چ خوون افتادە دەر دلها

دلا هەرچی بلێ ناصح لــەنیك بــەد بەجێی بێنە
کی سالیك بی خەبەر نەبووەد زو راه و رەسمی مەنزلها

محلی رحلتە دونیــــا رەفیق ایمرو زو فەردایــە
جەرەس فەریاد میــدارد کی بــەر بەندید محملهـــا

لەبیمی مەوجی دەریای أهلی دڵ زاهید خەبەر دار نین
کوجا دانەند حـــــــالی ما سەبو کبارانی ســاحیلها

قسەی من شوهرەتی شــارە تەمامــە تازە بی پۆشم
نیهان کەی ماند آن رازی کەزوو سازەند محفلهـــا

وصالی دولبەرە «سالم» معظم تر لەهەر مطلب
متــی ما تلق مــن تهــوی دع الدنیــــا واهملها



شەهیــدی دیدەیی مخموری شۆخێکم منی شەیــدا
لە خاکی مەشهەدم نەزدیکە دەربێ نێرگسی شەهلا

بــە محضی امتحان دەستم بنێرە باخەڵت یــەك دەم
لە بن دا بی برین راضیم ئەگەر نەیبوو یەدی بیضـا

---

«*» لەهێندێك کەشکۆلان نووسراوە ( لەدڵ دەر کەین ) . ئاشووب : کێشــە .
ئەفشان : بەخشان . نیکوبەد : چاك و خراپ . بیم : ترس . نەزدیکە : نزیکە

بە ئومێدی وەفای گوڵ بولبولی مسکین چ سوودی بوو
بەڵایە ڕامی عاشق کەی ئەبێ مەعشوقی بێ پەروا
بە فیکری مووشکاف ئەمشەو قیامم کرد لەڕووی زوڵفت
بە تاریشی بە طوولیشی بەقەد تـــاری ئەبوو یەلدا
حەدیثی ئەنگ و نامم زۆر شوکر مەشهووری عالەم بوو
لە حەرفی مدعی ناکەس نیـــە باکم منی ڕیسوا
لە پەستی بۆ دەکێشن زاهیدی غافل چلەو خەلوەت
بچن عاشق بە باڵا بن بڕۆن بۆ مەرتەبەی باڵا
لە کاری هائل و صعبا گوریزە چارەیی مەردوم
ڕەهاکەن «سالم»ی بێدڵ لە«عەشقا ماوە بێ پەروا»«☼»

---

غەم وەکوو بەم هاتە جۆش و کەوتە گێژاوی بەڵا
ئاوی هائل زایە کەشتی کەوتە حاڵی حەولەولا
شەطی محنەت هات لەسەردا کەشتی هۆشی ڕاڕفاند
بادی غەم لێم بوو بەشورەڵە جیەرێ شادیم تێک شکا
کەمیە کەوتە گێژی ئەمرود تەن وەکوو ئاش هانە گەڕ
بای مراد کەی دێ خەبەردا تۆ خودا ئەی ناخودا
دادی دەریای محنەت و تۆفانی غەم با بەس بدەم
بێمە شەرحی بەد فیعالی ڕۆژەبی دامەن سیا
ئەی ڕەفیقی کۆن لەکووێن ساوەك حەسار دەورم بدەن
بێ جڵەو سووارم وەرن سەیرکەن لە بارگیری قضا
ئەسپەکەی بۆز ترسەنۆك و سەرکەش و توند شیرەتە
واسڵە گەر خشپە بێ جووتە لە کلکی خۆی دەدا

---

«☼» لە کەشکۆڵی ٢٣ دا وا نووسراوە ( ولا کین سالمی پەکدڵ لەعەشقا ماوە با بەرجا
مووشکاف : مووقەڵێش. ئەنگ و ناو : ناوو نرتك. ڕیسوا : بێ ئابڕوو.
هائل : سامدار. گوریز : هەڵاتن. ڕەهاکەن ڕزگارکەن. بای شرط :
بای سازگار. ناخودا : کەشتیەوان. سڵ : توورە، زیز.

سپیە سەرباڵ موویی شەبرەنگ ژێر قەپووزو پاڵو دووی
کەندی باخەڵ جووتە پێشانی چەپ و ڕاست دەستو پا
گەر زرنگەی پلپلەی زەنگو جەرەس بکەوێتە گووێ
جووت لەسەر پاشوو دەوەستێ مثلی وورج دێتە سەما
گەر لە لایێ دابەزم بـا زینەتم بێ سوواری بێ
ئاوزەنگی نادا لە دەورەم دێتە خـول وەک ئاشی بـا
کەی لە گوویێ جۆگە دەگەڕێ دێم بەتوندی لێی خوڕم
تاقو جووت جووت ئـەبێ و داوێژێ پاڵوو هەڵئەکا
گوایە اظهاری غووروری خۆی دەکا دێم زینی کەم
هەڵدەتووڕێنێ وەکوو گای بار نەبەر خۆی شێت ئەکا
دەست ئەبەم زینی بکەم چونکوو لەسوواری عاجزە
بۆ لەقە خۆی خۆش ئەکاتو مۆڕ ئەبی لێم لا بـەلا
کاو و جۆی گەر بێنیبە پێش وەک کەردەلوو شکێنی بەتاو
گەر لەغاوی بۆ بەرم بـۆ جووتە پاشووم تێ دەکا
وەک کەری دێز فەوتی خۆیو محنتی خەڵکی دەوێ
هـەر لەناکاوا بەعمداً خۆی لەخەو خوڕ دادەخـا
وەک سەگێکی پەت پسێنی بێ سەنەک ببڕێ بەفێڵ
دەم دەبا کەلبەی لـە پێچکەی لا لغاوەی گیر دەکا
وەختی ئالیک ڕوو بە ماڵ وەک بای شەماڵ شیرین ڕەوە
بۆ ڕێگەی تعجیل ئەوەندە سستە دەڵێی وا داوەشـا
گەر حەی ئەحمەد بڵێ بۆز خۆش ڕەوە باوەڕ مەکە
امتحانم کرد لە مەرگە واقعا قـۆڕ ڕا دەکا
گەر لە بازاڕ بیفرۆشی دڵم نەبێ کەس نایکڕێ
بۆ بنی هێڵەک لەکن مـن کلکو یالی دەس دەدا

دوو قرۆش بۆ نالی شایی کلکی . چەرمی دوو رِیال
پێنج قرۆش و شایی نرخی بۆزی کەم بەها
وەك خەر قوشچی چەقەل فێر بوون حسابی فارسی
ئەستێرە دەژمێرن داخوا لاکی بۆزکەی دێتە لا



زەورەقە دڵ دیدەیە دەریا و مەردوم ناخودا
جۆشی خاتر وەك شەپۆل و غەم نەهەنگ لەنگەر جەفا

جان مسافر تاجرە ئاهم تجارو تان مەتاع
کەمیە عەرق و دوورە ساحل دڵ لەرِێی بێمو بەلا

دایە دِرکی غەم بەرِووی دڵما هەتا دونیا هەیە
دەرگەیی شادی بە وەعدەی تا قیامەت داخرا

شوعلە وەر نابێ چرای شادی بە بەر یادی فیراق
تاگری محنەت لە خەرمانی وجوودم هەڵگرا

شەوقی دانەی خاڵی تۆ خستوومیە ناو داوی خطر
بەم گوناهە ئادەمیش وەك من لە جنت دەر کرا

جەذبی کرد تاثیری ناڵەم دەردە دارانی ضەیف
با وجوودی رِەنگی کاهی بوومە رِەنگی کارەبا

عومری دڵ دیسان بە پا جۆشا ئەهاتە رِوویی کا
بۆنی زولفت خاکی صحرای کرد سەراسەر مشکبا

هەر کە غالب بم لەفیکرا دڵ دەچێتە بەردەوە
پەی بەوی نابا ئەوی ناگاتە پەی پەیکی صبا

زولفی حەییە پەروەرە « سالم » ئەبەد ئەیمەن مەبە
بەم قەرارە قەت مەکە بازی بەحەلقەی ئەژدەها

---

لاك : کەلاك . ناخودا : کەشتیەوان . کاه : کا
مشکبا : بۆنخۆش . بازی : یاری ، گەمە .

معجزەی یاری :- ەری چیهرە دڵارامم دەکا
ئاوی ساوە ، تاقی کیسرا ئاگری زەردەشت فەنا

ڕووی جیهان بێ ڕەونەقە یـاران بڵێن با دەر کەوێ
سەرو قەددی جامە نەسرین ماهرووی مەخمەل قەبا

هۆش لەکووێ ؟ ئارام لەکووێ ؟ هەر قوڕ بەسەر خۆمو خیرەد
چـاوی پڕ ئەفسوونی من . . . بـە ئیمـا دەبـا

بەخو بەخ یاران تەماشای جیلوەی ئـەم شیرینەکەن
دیدە ئاهوو عەنبەرین موو مشك بۆ حۆری لەقا

ڕووی دڵارامم بەهەشتێکە لـە امکانی خلوود
ئاری ئاری عیشقی نەسلی ئادەمی بـوێـە دەکا

دڵ هەمیشە ناسرەوێ هەرگیز لەپێکانی موژەی
دەم بە دەم ئیما بەئیما دێ وەکوو تـیری قضـا

ڕەشکی نازی بۆنی زوافی قەابی خونچەی کرد بەخوێن
وا لەگەرد نیا خەڕاجی گەردەنی ئاهووی خەتا

گەر لە سایەی ئاستانەی دولبـەرم جێ دەست کەوێ
قەت هەوەس ناکەم ئەمن ئیتر لەژێر پەڕی هوما

جان موحەققەر نەقـد دەر کەف سەرفکەندەو چاوەڕێ
خوسرەوی خووبان بڵێن ( سالم ) ئەوا پێشکەش ئەکا

---

پەری چیهرە : ڕوخسار پەری . خیرەد : هۆش (عقل) . مـاه ڕوو : ڕوو مانگ . پڕ ئەفسوون : پڕ فێڵو ساختە . پەیکان : تیر ، سەرەنێزە . ئیمـا : ڕیك ( اشارە ) . ڕەشـك : داخ ، چاو پێ هەڵنەهاتن . سەرفکەندە : سـەر شۆڕ . خوسـرەوی خووبان : پادشای جوانان .

ئاخ و داخ دڵ غافلە نازانێ قسمەت چی دەکا
ئەمڕۆ وا لێرەم بەڵام ئاخۆ بەیانی کوویێم دەبا

شاتری تەقدیر کە پێشکەوت ڕاتەکێشێ و تۆ دەڕۆی
کانێ دەیزانی کەوا خستوویە ناو دامی بەلا

چڵە خورمایە منیش مێشێکی زۆر شیرین پەرست
نەفسی سەرکەش ڕوو لەخورمای کوردکوژی بەدفەڕ دەکا

ڕەهبەری قسمەت جڵەوکێش بردیە مالی......
کاشکی هەرگیز من نەچووماییە بەڵام چارم نەما

حوجرەیێکم کەوتە دەستو کەوتمە ناوی وەك قەفەز
وەك کەوی تۆڕ دڵ لە برسانا لەسینەم سەر دەدا

من چەپۆکم دا بەسەرما ئەسپەکەم سکوڵی کرد
تازەمان کرد هەردوو لا شینی شەهیدی کەربەلا

ئەهلی کووفە ئاو بڕیان کردووە لەمیوانی عەزیز
خانە خوێی من مەنعی نان و ئاوو ڕێو جێم لێ دەکا

خانەخوێیم میوان نەوازە وەرنە سەیری پیاوەتی
دۆشەکی خۆم خاك و خۆڵ سەر ڕاخەری ئەسپم سەما

شیشی سوور بێنن وەرن خاڵێکەمان داغ کەن بەجووت
چونکوو ژانمان کرد من و ئەسپم لەبەر سەردی هەوا

ئەمن و بارگیری کوویێت هەردوو بنووین بەشکم بەخەو
من ببینم ڕووی خۆراك و ئەو ببینێ ڕوویی کا

ئاخوڕی ئەسپم هەوایە خوانی خۆراکم خەیاڵ
هەردوو برسی ماینەوە وا چاکە ڕوو بکەینە هەوا

---

کاشکی : خۆزگە.      هەرگیز : هیچ کاتێکی.

ئاهی خۆم بۆ نانی جۆ سەکۆلی ئەسپم بۆ حەشیش
ئەو گەیشتە پشتی ماهی ئەم گەیشتە ڕووی سەما

چاوی قووچان ئەسپەکەم باقلم تەویلەی کەوتە یاد
دلّ لە سینەم هات و ڕەنگە یادی جێگەی خەو بکا

لووتی داژەند ئەسپەکەم خۆم دەستەو ئەژنۆ شۆڕەمل
من لە فیکری حالی ئەو ئەو شێنی حالی من دەکا

ئەمن و ئەسپ هەردوو بەجووت ئوستاد و شاگردی خەیال
ئەو لە نەقشی توورەکە من بۆ حەسیری بووریا

شامە میغناتیسە بۆ بۆنی کەبابی سەر گوزەر
لێوی ئەسپ بۆ جاذبەی پووشی بە میثل کەهرەبا

سەیری کەن یاران لە برسانا ددانی ئەسپەکەم
بۆ بژارەی پووشی ناو خشت کاری دیوار بڕ دەکا

سەنگ کرۆژێکە لە برسانا ددانی گردە کوویت
هەردەلێی بازاڕی ناو شارو خەیاری نووێ دەخووا

وا دەزانێ زینەکەی پالانی پووشە گردە کوویت
وەک مەقاش جار جار لەلاوە لچ لەلا پچکەی دەخا

یاخووا تووشم نەبێ ئیتر .... تا حالی مەرگ
ئاینە کەسبی چەلا حەیفە لە خاکوستەر بکا

گەر .... بەم نەوعەبن با شیری ... یێتە ناو
وەر زەبیب تەبەە هەزاران مەرحەبا اهلا سەفا

---

حەشیش : پووش. سینە : سنگ. داژەند : شۆڕ کردەوە.
خاکوستەر : خۆلەمێش.

صبحی نەورۆزە وەختی بەزمی شەراب  الصبوح الصبوح یا اصحاب
ئەصلی عیش و نیشاطە هەی ئامان  المدام المدام یا احباب
بولبولان مەستو گوڵ قەدەح دەر کەف  بەس بنۆشید دائما مەیی ناب
پیری مەی ئێستە کێ قبول ناکا  کێ بپەندی مەیکەدە بە شتاب
ئەی حەریف هەفتەیێکە ناوی بەهار  راح چون لەعلی ئاتەشین دەریاب
دەری مەیخانە بەندە رێگە نیە  افتح الباب یا مفتح الابواب
وەرە «سالم» لە حاڵەتی عیجزا  هەمچو حافظ بنوش ئەز مەیی ناب

لە زولف و پەرچەمت بۆ کولمو غەبغەب  موهەیایە لەڕووی دڵ مارو عەقرەب
لە خاکی ئاستانەت تا مقیم بم  کفایەتمە لە جێی انعام و منصب
لە لەوحی تەربیەت نەیخستە یادم  بە جوز ئەلفی قەدرت استادی مکتب
بەری حوسنە بەری تا تۆ دیاری  لەڕووی مەه نانوێنی شەوقی کەوکەب
لەبی تەشنەم خەریکی ذیکری تۆیە  هەتا ڕووحم لەتەن دا دێتە سەر لەب
طەلەب ناکەم لە قاپی کردگارا  بە غەیرەز وەصلی دولبەر هیچ مطلب
قەلەم سەرخۆشە «سالم» بۆ تردد  لە تعلیمی بەلاغەت مثلی مەرکەب

چوومە سەر ضیافەتی مەلا بەکری عالی جەناب
چ بڵێم خەڵکینە بۆم نایەتە بەر مەددی حساب
خولاسە جێ بەجێ بووین ڕێز بەڕێز ئێمە لەخوارو ژوور «*»
هێنایان هەر بەدوو کەس سینی یاپراخ و کەباب
ئەوی مقبول بێ لەلای خەڵکی قسەی مختصرە
بوو بەهاو سینیی من زۆر خۆرەکەی خانە خەراب

---

دەر کەف : لەلەپی دەستیدا . شتاب : تاڵوو کە . بەندە : بەستراوە . مەه مانگ
غەبغەب : بەرخەبەبە . تەشنە : تینوو . لەب : لێو .
«*» لەناو هەموو دەستنووسێکیدا درێژەو هەڵبەستەکەی لە کێش خستووە .

کۆلارەی لێــوی کەزنی ســەر سینی بوو
له تاوان جووچکی ژێر دەوریە کە بوو بە کەباب
هەموو جار چواردە یاپراخ و دوو جووت نانی قەوی
بای دەدا لوولی دەدا قــووتی دەدا مثلی دەواب
چەنکی گورگی کەبەیەك حەملە لە گۆشت رامالێ
هاتە یادم سەعەتی زەحمەتی مەرِ جەوری قەصــاب
دەروونی هاتــە جۆش و طلبی دۆی ترشی کرد
کاسە دۆی نایە سەرو دوو قوومی لێ دا بە شیتاب
القصە ئەو شەوە بەد بەختــە وەهای کرد بەخورش
وەختە بوو فیرِ تەبەق و نان لەمەلا بێتە جــەواب



لەرِوی تیری موژەی خونرِیزی محبوب
سەراسەر ملکی دلّ پرِ بوو لە ئاشووب
سوپای بەرگەشتە بوو چاوت لەموژگان
شکاندی غالبی دلهــا بــە مەغلووب
بەسەر دلــا حەوالەی غەمزە تا کەی
دەبێ چی بێ خەراجی ملکی مەخروب
بلێن بازشت رِوو دیبـــــا نەپۆشن
چ حاصل سور مەسایی چاوی مەعیوب
لەرِووی میهرا بــە اقــدامی عیــادەت
ئەگەر مجروحی یاد کا یاری مەحجوب
موژەم باهەم بەرشتەی دلّ دەبــەستم
دە کێشم رِەهگوزاری جوملە جاروب
گەیاندی بۆم سەبا بۆی عطری گێسوو
وەکوو پیراهەنی یوسف بــە یەعقوب
لــە حــەشریشا سەرو کارم لــە عیشقە
ئەگەر دەستم بگاتــە دەستی مطلوب
لە عەشقا هەر منم هامدەرــی مەجنون
لە صبــرا هــەر منم ئوستادی ئەیوب
فیراغەت صعبــە بــۆ عاشق لە هیجرا
بە «سالم» ژەهرە بێ تۆ أكل و مشروب

---

شیتاب : تالوو کە. موژە : مژۆلّ. ئاشووب : پشێوی. خـــــەرِاج : باج.
بەرگەشتە : گەرِاوەوە ، شکاو. زشت رِوو : ناحەز ، ناشیرین. سورمەسازی :
کلمرێژی. رجاروب. گەسك. پیراهەن : کراس.

ڕاستە دڵ چەسپە وەلێ شادە لە گیسوویی حەبیب
چونکە نەزدیکە بەدایم لە گوڵی ڕوویی حەبیب
بە دوعا نابێ ڕەوا حاجەتی ئەربابی وەفا
ڕوویی دڵ تا نەکەنە قیبلەیی ئەبرۆیی حەبیب
لە طەوافی حەرەمی کەعبەیی ئەربابی وەفا
وەکوو حەجاجی حەبەش سلسلەیی موویی حەبیب
دیدە شیرینە کە پڕ بێ لە سرشکی شۆرم
چونکە تێی دایە لەعەکسا قەدی دلجۆیی حەبیب
گەر خۆی جاذیبە هەنگامی تەوەجوهـ دڵی شێخ
وەکوو من جذبە لە ڕووی دیدەی جادوویی حەبیب
بێ بەسەر قیبلەیی دڵما وەرە ئەی بادی سەبا
بەدەمێ تازە کە ڕووحم لە قضای بوویی حەبیب
ئاگری جەوری لە خەرمانی وجوودم بەربوو
قوڕ بەسەر سالمی بێچارە لە دەس خوویی حەبیب



ئاوی حەیاتی منە بۆسەی لێوی حەبیب حالی مەماتی منە دیدەنی ڕوویی ڕەقیب
شانە لەزولفت مەدە جێی دڵی ئاوارەیە حەیفە مەشێوێ بەساسکنی مسکین غەریب
غیری لەبت کێ دەکا چارەی دەردی دڵم نبضی منو دەردی من دوورە لە فکری طبیب
دیدەو ئەبرۆیی تۆ فیتنەیی ماهی صەفەر دیدەیی جادووی تۆ مایەی حیلەو فریب
ڕەونەقی گوڵشەن دەچێ شاهیدی گوڵ وون دەبێ
ئاخری ماهی بەهار قوڕ بەسەری عەندەلیب
ئاخری دەی هەردولا دەولتو بێدەولتی پەیکی أجل طی دەکا هەرچی فیرازو نشیب
کفرە ئەگەر در کەوێ ڕەخنەیە بۆ کاری دین سجدە لە ڕووی لێ دە کەن قاضیو شێخو نقیب
ضدی یەکن یەك بەیەك نارو خەس ئاوو نەمەك شاهیدو عەهدو وەفا سالم و صبرو شکیب

